# هۆنراوەی



# ئیمان و ئیسلام

هۆندنەوەی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

چاپی دووەم

# بسم الله الرحمن الرحيم

**﴿اَلْحَمْدُ لله رَبِّ اَلْعالَمِينَ وَالصَّلاةُ والسَّلام عَلىٰ سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ اَجْمَعِين.**

**اَمّا بَعْدُ:**

فَقَدْ قالَ عُمَرُ بنُ الخطاب رَضِيَ الله عَنْه: بَيْنَما نَحْنُ عِنْدَ رَسُول الله ﴿ﷺ﴾ ذاتَ يَوْمٍ، إذْ طَلَعَ عَلَيْنا رَجُلٌ شَديدُ بَياضِ الثِّيابِ، شَديدُ سَوادِ الشَّعرِ، لايُرىٰ عَليه أثرُ السَّفرِ، وَلا يَعرفُهُ مِنا اَحَد، حَتىٰ جَلَسَ اِلى النَّبيِّ ﴿ﷺ﴾ فاسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ اِلىٰ رُكْبَتَيْهِ، وَوَضَعَ كفَّيْهِ عَلىٰ فَخِذَيْهِ، وَقالَ: يامُحَمد أخبِرْني عَنْ ألاسْلام، فَقالَ رَسُولُ الله ﴿ﷺ﴾ اَلاسْلامُ اَنْ تَشْهَدَ أن لاَ اِله اِلاَ الله وَاَنَّ مُحمداً رَسُولُ الله، وَتُقيمَ الصَّلاةَ، وَتُؤتِيَ الزكاةَ، وَتَصُومَ رَمضانَ، وَتَحُجَّ اَلْبَيْتَ اِن اسْتَطَعْتَ اِلَيْهِ سَبيلاً، قالَ: صَدَقْتَ، قالَ: فَعَجِبْنا لَهُ يَسْألُهُ وَيُصَدِقُهُ، قالَ: فَاخْبِرْني عَن الأيمانِ، قالَ: أنْ تُؤمِنَ بِالله، وَمَلائكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَاليَوم الآخر، وَتُؤمِنَ بالقَدَر خَيْرِه وَشرِه، قالَ: صَدَقْتَ، قالَ: فاخبِرْني عَنَ الاحْسان، قالَ: أنْ تَعْبُدَ الله كَأنَكَ تَراهُ، فَاِنْ لَمْ تَكُنْ تَراهُ فَاِنَهُ يَراكَ، قالَ: فَاْخبِرْني عَن السَاعَة، قالَ: ما المَسْؤولُ عَنْها بِاَعْلَمَ مِنَ السّائِلِ، قالَ: فَاْخبِرْني عَنْ أماراتِها، قالَ: اَنْ تَلِدَ الأمَةُ رَبَّتَها، وَأنْ تَرىٰ اَلْحُفاةَ العُراةَ اَلعالَة رعاء الشاء يتطاوَلُونَ في اَلْبُنْيان، قالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثْتُ مَلِياً، ثُمَّ قالَ لي: ياعُمَرُ اَتَدْري مَن السائِلُ؟ قُلْتُ: الله وَرَسُولُهُ اَعْلَمُ، قالَ فَاِنَّهُ جِبْرِيلُ آتاكُمْ يُعَلِمُكُمْ دينَكُمْ. رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم

ئەی موسڵمانی خۆشەویست: ئەوا بە درێژی و، بە هەڵبەست مەبەستی ئەم حەدیسە روون ئەکەینەوە.

# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحیم

بە ناوی خودای گەورەو میهـرەبـان
دانـەری زەمـین ڕاگـری ئاسـمان

هەزاران سەلات هەزاران سەلام
لەسـەر (محمد) پێشـەوای ئیسـلام

هەم لەسـەر ئال و سەحابـەی نازدار
هەتـا حەز ئەکـا خودای کردگـار

ئومـێـدم وایـە لە بۆ کورد زمـان
نەختێـك لەئـایـین بنـوسم بۆیـان

چونکـە پێـویستـە لەسـەر موسوڵمان
بۆ خۆی بزانـی ئیسـلام و ئیمان

## «ئیسلام و روکنەکانی ئیسلام»

خودامـان (الله) [illegible]سـلام دینـمانـه
هە[illegible]مـد) ﷺ پێغەمبەرمانە
ئیسـلام پ[illegible]ی ئەڵێن ئەرکان
[illegible]و شەی شەهـادەو ئیـمان
دووەم پێنج نوێژە، سێیەم زەکات دان
چوارەمـین رۆژووی مانگی رەمـەزان

پێنجەمین (حەجە) لەم پێنج روکنانە
بۆ ژن و پیــاو گشتی یەکســانــە

## ١ـ «مانای وشەی شەهادە»

أشهد أن لا الهَ الاّ اللّه وأشهدُ أنّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّه
ئەڵــێــم بەزوبــان، گومــانــم نیــە
جگــەلــە (الــلّه) هیــچ خودا نیــە
هەروا (مــحــمــد) نێردرواى خوایــە
ئەو پێغــەمبــەرى هەمــوو دنیــایــە

## ٢ـ «باسى نوێژ»

پێنــج نوێـژ پێـویستە لەسەر موسوڵمان
بیکــاشــەوو،رۆژ تەنهــا بۆیــە زدان
هەر کەس نوێـژ نەکــادو ژمنى خوایە
چونکــە کوڵــەگــەى دینى رمــایــە
نیــوەڕوو، عەسر هەر یەك چوار رەکات
نوێــژى رۆژ ئاوا، بیکــەسێ رەکــات
هەروا چوار رەکــات نوێــژى عیشــایە
بەیــانیــان دووە، فەرمــانى خوایــە
دەستنــوێژت بشۆ، بەرگت خاوێن بێ
لەگەڵ جێگەى نوێژ، رووت لە قیبلە بێ
نیــەتى نوێـژ بێنــەو، جمو جوڵ مەکە
بێ پێکــەنــین بەو، گفتــو گۆمــەکــە

## ٣ـ «باسی زەکات»

زەکـــات ئەمـــەیـــە ئەی برای نازدار
هەر کەس زەنگینە، لە ساڵێ یەك جار
نەختێـــك ماڵی خۆی بەدڵێکی شیرین
بیداتـە هەژار، هیـچ نەبێ غەمگـین
وەکــو گەنم و جۆ، هەم زێـــروپـارە
هەروا بزن و مەر، ژمـــارەیـان دیـارە
ئینجـــا سەرفیـــترەی مانگی رەمـەزان
لە جیـــاتی خۆتـــان، ژن و منـــاڵتـان
نزیـــك دوو کیـلۆ گەنـمی پاك کراوە
یا نرخـــی ئەوە بریـــار دراوە

## ٤ـ «باسی رۆژ ووی رەمەزان»

ئەوجـــا پێـویستـە لەسـەر موسوڵمـان
کە بەرۆژوو بێ مانـــگـــی رەمـــەزان
رۆژوو لە ئیســـلام، وا بریـــار دراوە
لەکـــاتـــی بەیـــان، هەتـــا رۆژ ئاوا
خواردن حەرامـــە لەگـەڵ خواردنـەوە
هەر جۆری هەبێ، هەروا رشاندنەوە
لە قسـەی پروپـوچ لەگـەڵ جنێـودان
زوبـانت بگرە، هەم لە درۆو بوختان

## ٥- «باسی حەج و عومرە»

لە تەمەن یەك جار ئەی برای دڵسۆز
برۆ بۆ (مەککە)ی خاوێن و پیرۆز
ماڵی خوای گەورەوا لە مەککەیە
بۆ موسوڵمانان هەر ئەو قیبلەیە
لەوێ حەج بکە هەروەها عومرە
تا لێت ببوری خواوەندی گەورە
لە دوای حەج برۆ لە بۆ (مەدینە)
شاری پیرۆزی سەروەری دینە
بکە زیارەتی پێغەمبەری خۆت ﴿ﷺ﴾
تا لەلای خودا شەفاعەت کا، بۆت

## «باسی روکنی ئیمان»

ئیمان پێك هاتووە لەم شەش بەشانە
باوەر بە خوداو، مەلایکەتانە
لەگەڵ کتێبی خواو، هەموو پێغەمبەر
رۆژی دوایی، هەم قەزاو قەدەر
هەر کەس بەو شەشە باوەری نەبێ
یان بە یەکێکیان، ئەو کافر ئەبێ

## ١- «باوەر بە خودا»

یەك خودا هەیە ناوی (اللە)یە
خاوەنی هێزە هەر ئەو توانایە
هیچ کاتێك ناوێ، بۆ رژانی نیە
بێ دایك و باوکەو منالی نیە
هەر ئەو زیندووەو هەرگیز نامری
بیسەرو بینەر: هەرچی بکری
هەر چی روو بدا، هەرچی روویدا بێ
گشتی دەزانێ لێی تێکەڵ نابێ
خاوەن گوفتارە بەس دەنگی نیە
هەرچی بیەوێ بەرپێچی نیە
دروستی کردوین، تا بیپەرستین
ئەبێ بیناسین لێشی بترسین

## «٢» باسی باوەر بە فریشتەی خوا «مَلائِکة»

باوەرت هەبێ، برای موسلمان
بە فریشتەی خوا لە ئەرزو ئاسمان
بێ خەو وخواردن، نەنێرن نەمێن
لە خواپەرستی هیچ کات ناحەسێن

یەکیان (جُبرائیل) بۆ وەحی هێنان
هەروا (میکائیل) بۆ رزق و باران
بۆ دونیا تێک دان بلێ (إسرافیل)
بەوەی روح کێشە ئەڵێن (عِزرائیل)
(مُنْکَر) و (نَکیر) لە ناو گۆڕی تار
دوو لە راستەو چەپ، ئەنوسن کردار
جگە لەوانەش فریشتە زۆرن
هەر خوا ئەزانێ:ئەوان چەند جورن

## ٣- باوەر بە کتێبی خوا

ئەو (کتوبانەی) فەرمودەی خودان
ڕاستن، کە هاتوون بۆ پێغەمبەران
(صُحُف)ی ابراهیم (تَوْراة)ی موسیٰ
(زَبُور)ی داود (اِنجیل)ی عیسیٰ
هەروەها (قُرآن) لە بۆ پێغەمبەر
واتە: محمد ﴿ﷺ﴾ سەرداری بەشەر
لەوکاتەی قورئان هاتووتە خوارێ
بێکار بوون ئەوان گشتی بە جارێ
سورەتەکانی قورئانی پیرۆز
سەدو چواردەیە، ئەی برای دلسۆز
هەر کەس بخوێنێ:سی جوزوی قورئان
زۆر خۆشەویستە لای خودای (مَنّان)

## ٤ـ باوەر بە پێغەمبەرانی خوا

پێغەمبەر پیاوە، ڕاست گۆیەو هوشیار
ڕێی چاك و خراپ ئەو ئەیک دیار
لەلای خوداوەنـد وەحـی لە بۆ دێ
بێ عەیب و گونـاهە، بەچاو ئەدیترێ
سەدوبیست و چوار هەزار پێغـەمبـەر
هاتـون لە دونیـا گشتی سەرانسـەر
لەوانـە پێنجیـان گەورەو بەرێـزن
ئەو (أُوُلـو الْعَـزْم)ن،گەلێ ئازیـزن
(نوح) و (ابراهیم) حەزرەتی (موسیٰ)
(عیسیٰ)ی مەریەمەو (أحمد) موستەفا

### «باسی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾»

گەورەی هەموویان ﴿رَسُولُ اللّه﴾ یە
واتـە: (محمد) ﴿ﷺ﴾ چرای دنیایە
هیـچ پێغـەمبـەرێك لە دوای وی نیە
کێ موسـولـمـان بێ: ئومـەتی وی‌یـە
باوکی پێغـەمبـەر (عبـد اللّه)ی ناوە
دایـکـی (آمِـنَـة) هەروا زانـدراوە
(عـبـد المـطّلب) باپـیری وی‌یـە
نەتـەوە (عـەرەب) ئەو (قـورەیشی)یە

## «باسی لەدایك بوونی پێغەمبەر» ﴿ﷺ﴾

لە دوانــزەی مانـگـی (رَبیـعُ الأول)
ڕۆژی دووشـەمـەی پڕ خۆشیو مەشخـەڵ
لە (مەککە)ی پیرۆز ئەو لە دایك بوو
بەهــاتـنـیوی دونـیــا ڕوونــاك بوو
چونکــە پێغــەمبـەر باوکی نەمـابـوو
لەلای باپــیری بەخـێــوکــرابــوو
(حَلیمَە) ی سەعدییە شیری پێ داوە
تەمەن شەش ساڵ بوو، دایکی نەماوە

## باسیْ هاتنی قورئان و، بوونی بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

ڕۆژی دووشــەمـە حەڤـدەی ڕەمەزان
(جُبْرائیل) هات و، بۆی هێنا قورئان
لە شاری (مەککە) ئەشکەوتیْ (حیرا)
تاوەحــی وەرگــرت زۆر ئازار درا
جاری یەکـەمـین سورەی (إقْـرأْ) بوو
کرایـە پێغەمبەر، تەمەن چل ساڵ بوو

## سەرکەوتن و شەو ڕۆیی: اَلأسْراءُ وَالْمِعْراجُ

لە مانگی (رَجَب) شەوی بیست و حەوت
شەوڕۆیی کــــردو، بۆ ئاسمان سەرکەوت

## کۆچ کردنی بۆ (مەدینە)و،وەفات کردنی

ماوەی سێزدە ساڵ کە بووە پێغـەمبەر
هەر لە (مەککە) بوو پڕ لەدەردەسەر
ئینجـا کۆچی کرد لە بۆ (مـەدینـە)
لەوێوە داینـا بنـاغـەی ئەم دینـە
لەوێش تا دە ساڵ هەر (جهاد)ی کرد
لە دوای سەرکـەوتن، جاوەفـاتی کرد
گۆڕی پیرۆزی لە (مـەدیـنـە)یـە
لەنـاو مزگـەوتە، دوو هاوڕێی هەیە
بیست و سێ ساڵان ئەو پێغەمبەر بوو
تیکرا تەمەنی شەست و سێ سال بوو

## «باسی منالەکانی پێغەمبەر»

سێ کوڕی هەبـوو ڕەسـولی کەریم
عبـداللەو، قاسم،لەگـەڵ ابـراهیم
چوار کیـژی هەبـوو، بلێ یەکـەمیـان
ناوی (زَیـنَب)ە هیـچ نیـە گومـان
(فـاطمـة)و (رُقَیّـە) جگـە لەوانـە
(أمّ کَلثـوم)ە زۆر باش بزانـە

## (چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر)

کە وەفـاتـی کرد ڕەسـولی نازدار
کرانـە جێنشـین چوار پیـاوی ڕێـزدار

ابــو بكــرو، عمــر، عثمان و، علي
پییــان ئەگــوترێ (خَلیفَــه)ی (نبي)
یەك لە دوای وی دی فەرمـانڕەوا بوو
ئیســلام سەر بەرزو، لە زێدە داپوو

## «باسی دۆست و دوژمنی موسولمانان»

سێ دۆست هەیە لە گشت شوێن و کات
خواو، پێغـەمبەرو، موسوڵمانی ڕاست
دوژمـنـت چوارن ئەی برای ڕێـــزدار
شەیتان و، نەفس و، کافرو، ستەمکار

## ٥ـ «باوەڕ بە ڕۆژی دوایی: ﴿اَلْیَوْمُ اَلآخِرِ﴾

کاتــێ کە مردی ئەی مرۆڤــی هەژار
دوو فریشتــە دێن ئەکـەونـە پرسیـار
کێیــە خودای تۆ؟ هەروا پێغــەمبـەر
ئایینت چیـیــە؟ وەلام دە، یەکســەر
قەبــر بۆ پیــاو چاك باغی بەهـەشتـە
لە بۆ پیــاو خراپ پڕ ئاگــرو سەختـە

## «باسی تیکچونی دونیاو، زیندو بوونەوە»

یەك مەلائیــکــە بە ئەمــری خودا
بەیــەك فوکــردن دونـیــاتـێــك ئەدا
کە هیـچ کەس نەمـا خوا ئەمـر ئەکـا
بۆ جاری دووەم فوێــکــی تر ئەکــا

هەرچی گیانداره هەروەك یەكەمجار
زیندو ئەبێتەو، دێتە وەگوفتار

## وەستانی مەیدانی مەحشەر ـ اَلْحَشر

هەندێك بەسواری هەندیك بە پێیان
هەندێك رائەكشێن لەسەر رووی خۆیان
بەرەو مەیدانی مەحشەر ئەبردرێن
تاخوا حەز بكاله وێ رائەگرێن
لەترسان هیچ كەس خزمی كەس نیە
رۆژ نزیك ئەبێ‌و، سێبەری نیە
لەبەر گەرمایی ئارەق دێتە خوار
زۆر كەس لە گۆمی ئارەق دەچنە خوار

## شەفاعەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

ئینجا (محمد) ﴿ﷺ﴾ رەسولی نازدار
ئەپارێتەوە لە خوای كردگار
دەست بە پرسیارو،وەلام دان ئەكرێ
چاكەو خراپە ئاشكرا ئەكرێ

## پرسیارو،وەلامی رۆژی قیامەت (اَلْحِساب)

ئەو شتەی كردوتە لەم دنیایەدا
دەربارەی خەڵك، یانە هی خودا
چاكەو، خراپەو، ئەو ماڵەی هەیە
چۆنت رابواردوە؟ پرسیاری هەیە

لەســەر کردەوەت دەست وەزوبـانت
گشتی شاهیــدە، هەم قاچــەکــانت

## دەفتەری کردەوەکان ـ صَحُفُ الاَعْمال

کردارو، گوفــتــار لەم دنــیــایــەدا
گشــتــی نوسراوە، چویتــە لای خودا
خۆشــی بۆ کەسێ: کە بە دەستی راست
وەرئـەگـری نوسراو، ئەچێتە جەننات
گەر بەدەستی چەپ وەربگرێ نوسراو
بۆ جەهــەنــەمــە شوێنی دیـار کراو

## (باسی تەرازوی رۆژی قیامەت ـ المیزان

چاکــەو خراپــە گشــتــی نوسراوە
تەرازوی راســتــی لە بۆ دانــدراوە
هەر کەسێ چاکـەی گرانـتر دەرکەوێ
جێگــەی بەهــەشتــە رازی یەلـەوێ
بەڵام ئەو کەســەی چاکـەی سوکـترە
ئەو قوربــەســەرەو جێگـــەی ئاگرە

## تۆڵە وەرگرتنی رۆژی قیامەت-اَلْقِصاصُ

هەر کەسێ ماڤ خەڵکی لە سەر بێ
وەکــو: کوشــتــن و، دزی کردبێ
یا جنێــوی پێ بداو، نامــوسی ببــا
یانــە زۆر داربــێ زیــانــی لێ بدا

جگــە لەمــانـەش، خودای کردگـار
تۆڵـە وەر ئەگـرێ لە چاکەی زۆردار
ئەیـداتــە ئەوەی زۆری لێ کراوە
گەر چاکــەی نەمــاو، داوا کارمــاوە
ئەوە لەجیــاتی خراپــەی هەمـوویـان
ئەیبــەنــە دۆزەخ هیــچ نیە گومـان

## «باسی حەوزی (اَلْكَوْثَرُ)»

پێش بچیە بەهەشت ئەی برای موسوڵمان
لەلای پێغـەمبـەر «ﷺ» تۆ ئەبیـە میوان
لە حەوزی کەوســەر ئاو ئەخـۆیـەوە
هێنـدە شیرینــە، تینـو نابیـەوە

## پردی جەهەننەم ـ اَلصِّراط

ئینجــاکــە مەحشــەر کۆتـایی پێ دێ
لەســەر جەهـەنـەم پردێك دائەندرێ
ئەبێ هەمــوو کەس پێـیــدا تێپـەرێ
وەك بروسـك و، وەك با، هەندێکیش ئەفرێ
هەنــدێکیش لەوێوا ئەکـەونـە خوار
بۆ ناو جەهــەنــەم، ئەکـەنـە هاوار

## «باسی دۆزەخ ـ جَهَنَّم»

قووڵی جەهـەنـەم حەفتـا ساڵ رێیە
گشتی ئاگــرە، حەوت شوێنی لێیــە

لە بۆ هەر شوێنێ هەندێك تاوانبار
ئامادەی کردوە خودای کردگار
هەر کەس بەگوێرەی گوناهی ئەسوتێ
کەسزای وەرگرت رزگاری ئەبێ
بەڵام ئەو کەسەی بە کافری بمرێ
ئەو یەکجاری‌یەو، رزگاری نابێ

## «باسی بەهەشت»

بەهەشت شوێنێکە لە ژور حەوت ئاسمان
تایبەت داندراوە بۆ ئیماندا‌ران
شوێنێکی وایە: چی دڵ بیەوێ
یان چاو حەز بکا، داندراوە لەوێ
نەسەرمای زستان، نەگەرمای هاوین
نەستەمی زوردار، هیچیان لەوێ نین
ناخۆشی‌و، قین وەمردن نامێنی
کەس دەرت ناکاو، لەوێ ئەمێنی
لە باغی بەهەشت لەژێر درەختان
رووبارو، جوگە دەروا زور ئاسان
باسی بە هەشتی قەت تەواو نابێ
وا باش ئەزانم کەوا کوتابێ

## «باسی قەزاو قەدەر ﴿اَلْقَضاء وَالْقَدَرُ﴾»

پێش بوونی (آدم) هەرچی رووی داوە
دوای بوونی ئەویش تا دنیا ماوە

ژیــان و مردن و ساغی و نەخــۆشی
بوونی‌و هەژاری‌و غەمناکی و خۆشی
هەمــووی بەویست و زانستی خوایــە
بەســەرهــاتــی تۆ تەواو نوسرایــە
بەلام پێــویــستــە هەر هەوڵ بدەی
لەبــەر چارەنــوس تەمبــەڵی نەکــەی
بەگــوێــرەی توانـات بچێژە زەحمەت
تا سەر کەوتــوبی لە دونیــاو قیامــەت

## «باسی چاکە ـ ﴿اَلْإِحْسٰانْ﴾»

چاکــە ئەمــەیە ئەی برای موســوڵمان
تۆ بپــەرستــی خواوەنـــدی (مَنّـــان)
هەروەك بیبیــنی بە هەردوو چاوت
ئەگــەر خواوەندیش نێتــە بەر چاوت
باش بیپــەرستــە چونکــە ئەتبینێ
شارەزای دڵتــە، هیــچ دانــامێنێ

## «پێنج پەنهانەکان»

پێنج شت پەنهانــە هەر خوا ئەیزانێ
دنیــای وێــران و، کام باران دێنێ
کۆرپــەی لەنـاو زگ دوا رۆژی چۆنــە
کاری سبــەینێ، مەرگ چ شوێنــە

## «نیشانەکانی دونیا وێران بوو»

دنیـا وێـران بوون نیشـانـەی هەیـە
هەنـدێـك بچـوکەو، هەندێك گەورەیە
دایـك خزمـەتچی کیژەکەی خۆی بێ
خانـووی پێخـواسان لە شارا دیار بێ
هەم ناکـەس بەچـە فەرمـانـڕەوا بێ
کوشتن زۆر بێ و، نامـوس هەرزان بێ
هاتنـەوەی (عیسێ) لە گەورەکـانـە
دەججـالی بەدخـو فیتنـەی زەمـانـە
گەڕانـەوەی ڕۆژ لەلای ڕۆژ ئاوا
تۆبـە نامێنێ و، دەرگـەی داخـراوە

## «کۆتایی»

سوپـاس بۆ خودا کە یارمـەتی دام
بکـەم بەهـەڵبـەست ئیمان و ئیسلام
ساڵی هەزارو چوار سەدو یازدە
مانـگـی ڕەمـەزان لە ڕۆژی چواردە
(عبداللە)ی گوناهبـار زۆر تکـا ئەکا
هەر کەسێ خوێنـدی: دوعای بۆ بکا

---

عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی
هەولێر ـ کوردستان
(١٤) رمضان (١٤١١) کۆچی

پێغـەمبـەری خۆشەویستمان، ناوی (محمد) ﴿ﷺ﴾ کوڕی (عبدالله) کوڕی (عبدالمطلب) کوڕی (هـاشم) لە هۆزی (قورەیشی) بوو، لە گەلی (عەرەب) بوو، لەشاری (مەککە) لە ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی مانگی (ربیع الأول) ساڵی (فیل) لە دایك بووە، کە ئەکاتە بەرامبەر (٢٠)ی (نیسانی) ساڵی (٥٧١)ی زایینی، کە تەمەنی بوە چل ساڵی تەواو، کرایە پێغەمبەر، لە ڕۆژی دووشەممە (١٧)ی مانگی ڕەمەزان بەرامبەر بە (١)ی (شوباتی) ساڵی (٦١٠)ی زایینی وەحی بۆ هات هەروەك باسمان کرد، کەوانـە: ئەو ڕۆژەی قورئـانی بۆ هاتۆتە خوارەوە: هەر لەو ڕۆژەشدا دراوەتە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ماوەی سێزدە ساڵ لە (مەککە) پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا کۆچی کرد بۆ (مەدینە) لە شەوی هەینی (٢)ی مانگی (ربیع الأول) ساڵی (١)ی کۆچی لە (مـەککـە) دەرچوو، بۆ (١٢)ی مانگ گەیشتە (قوبا) کە لە نزیك (مەدینە)یە، لەم سەفەرەدا ئیمامی (ابوبکر)ی صدیق هاوڕێی بوو، ئەم ڕووداوە بەیەکەمین ساڵی کۆچی دانـدراوە لە مێـژووی ئیسـلامدا، وە ئەکاتە بەرامبەر (٢٠ تا ٣٠)(ایلول) ساڵی (٦٢٢)ی زایینی. (دە) ساڵی تریش لە (مەدینە) پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا لە ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی (ربیع الأول) ساڵی (١١)ی کۆچی لە مەدینە وەفاتی کرد، کە ئەکاتە بەرامبەر (٨)ی (حزیران) ساڵی (٦٣٣) زایینی، جا هەر لە ماڵی خۆی، لە ژوورەکەی حەزرەتی (عائشە)دا نێژراوە، ئیمامی (ابوبکر)و ئیمامی (عمر)یش هەر لەو ژوورەدا نێژراون، ئێستا ئەو ژوورە کەوتۆتە ناو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە، کەوابوو: ماوەی (٢٣)ساڵ پێغەمبەرایەتی کردووە، تەمەنی (٦٣) ساڵ بووە.

